31

فەرموودە

هذا من فضل

لا إله إلا الله

# ٣١ فەرموودە لە گەورەیی لا اله الا الله



بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْد للهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِـنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يَضْلُلُ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدُهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدَاً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ،

سـەرەتا سـوپاس و سـتايشـی بەردەوام و بێکۆتا بۆ الله تعالی کە ڕێنمونی کردم و یامەتی دام بۆ ئامادەکردنی ئەم نامیلکە بچووکە بۆ خزمەت موسڵمان.داواکارم لە الله تعـالی لەپێنـاو خۆی لێمان قبوڵ بکان . ئەم نامیلکەیە باسی گەورترین و بەڕێزترین وشـە دەکات کە لە پێناوی دا ئاسمانەکان و زەویەکان دروسـت کراون ، وە هەموو مرۆڤ و پەریەکان لە پێناوی ئەوە وشـە گەورەیە دروسـت کراون ،وە هەر لەسەر دەمی پێغەمبەر نوح ـەوە علیە السلام تاوەکو محمد علیە الصلاة والسلام پێغەمبەران علیهم السـلام نێردراون بۆ گەیاندن و ڕوونکردنەوەی ئەم وشـە گەورە و بەڕێزە وە لە هەموو کتێبە ئاسـمانیەکاندا باسی لێوە کراوە ، وە هەر ئەم وشـەیە جیاوازی دەخاتە نیوان موسـڵمانان و کافران . جا بۆیە وەشـەییکی هێندە گەورە و بەڕێز بەڕاسـتی جێگای خۆیەتی کە موسـڵمانان بزانن چیە و چ گەوەرییکی هەیە ، لەم نامیلەکەیەدا زیاتر لە سی فەرموودە هێندراوە لەباسی ئەم وشە گەورە و بەڕێزە وە فەرموودەی تریش هەیە بەڵام وەک وتراوە مشتێک نمونەی خەرمانێکە .

## فەرموودەی یەکەم

وعن معاذٍ قَالَ: بعَثني رســـولُ اللَّهِ ﷺ إلى اليَمن فَقَالَ:  إِنَّكَ تأْتِي قَوْمًا منْ أَهْلِ الكِتَابِ، فَادْعُهُمْ إِلى شَـــهَادةِ أَنْ لا إِله إِلاَّ اللَّه، وأَنِّي رســـولُ اللَّه، فَإِنْ أَطاعُوا لِذلكَ، فَأَعْلِمهُم أَنَّ اللَّه تَعالى افْتَرَض عَلَيْهِمْ خمْسَ صَلواتٍ في كلِّ يَوْمٍ ولَيْلَةٍ،..[1]

واتا ; لە معاذ ـــــــەوە فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ ناردمی بۆ یەمەن ، پێمی فەرموو تۆ دەچیت بۆ لای قەومێک خاوەنی کتێبن [کتێبێ ئاســـمانیان لەلایە] بانگەوزیان بکە بۆ ئەوەی شایەتی بدەن کە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله نەبێت و محمد نێردراوی الله تعالى ـــــــیە، جا ئەگەر گوێڕایەڵیان کردیت بۆ ئەوە، ئەوە فێریان بکە کە الله تعالى بە پێویســـتی داناوە لەسەریان کە لەهەموو ڕۆژ و شەوێک پێنج نوێژ ئەنجام بدەن،.

### چەند سودێک لەم فەرموودەیە

(1) گەورەیي وشەی لااله الاالله دەردەخات.

(2) ســـەرتا بانگەشـــەی خەڵکی بکەیت بۆ [لااله الا الله محمد رســـول الله]

(3) لەپێناو بانگەوزای کردنی خەڵک بۆ [لااله الا الله محمد رســـول الله] کۆچ بکەیت بۆ شار و وڵاتەکانی تر .

[1] [متفقٌ عَلَيهِ]

④بانگەشـــەی خەڵکی بکەیت بۆ [لااله الا الله محمد رســـول الله] ئەگەر چی بانگەشەکردنەکە بۆ لای خاون کتێبەکان بێت. دەتوانین بڵێین بانگەشەی گرووپ و تاقمەکانی ناو ئیسلام بکرێت کە لایان داوە لە و فەرمانە .

⑤بانگەشە کردن بۆ [لااله الا الله محمد رسول الله] لە پێش بانگەشە کردنە بۆ نوێژ کردن. نەک وەک کەســـانێک کە ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن بەوەی کە نوێژ بکات، بەبێ ئەوەی سەرتا بانگەشەی بکەن بۆ لااله الا الله محمد رسول الله .

⑥بانگەشـــە کردنی خەڵکی بۆ [لااله الا الله محمد رســـول الله] لە پێشـــترە لە بانگەشــــە کردن بۆ نوێژ و واجباتەکانی تر ، و بەبێ گوێڕایەڵی بوون بۆ [لااله الا الله محمد رسول الله] ئەوە گوێڕایەڵی بوون بۆ واجباتەکانی تر هیچ سود قزانجێکی نیە .

⑦پێغەمبەر ﷺ فێرمان دەکات کە بانگەشـەی خەڵکی بکەین بۆ [لااله الا الله محمد رســـول الله] وە هەتا گوێڕایەڵ نەبوون بۆ ئەو فەرمانە ئەوا فرمانی تریان پێنەکەین .

## فەرموودەی دووەم

قال طارق بن عبدالله المحاربي رأيْتُ رسولَ اللّٰهِ صلَّى اللّٰهُ عليْهِ وسلَّمَ مرتيْنِ مرةً بسوقِ ذي المجازِ وهو يُنادي بأعلى صوتِهِ يا أيُّها الناسُ قولوا لا إلهَ إلَّا اللّٰهُ تُفلحوا، ..[2]

واتا ; طاریقی کوڕی عبدالله ـــــی محاربی فەمووی : دوو جار پێغەمبەرم بینی ﷺ جارێکیان بەدەنگی بەرز له بازاری مجاز دەیفەرموو ئەی خەڵکینە بڵێن هیچ پەرستراوێک نیه شایەنی پەرستن بێت بەحق تەنها الله تعالى نەبێت ،تا سەر فراز بین ..

### چەند سودێک لەم فەرموودەیە

1) گەورەیي وشەی لااله الا الله دەردەخات .

2) بانگەوزای خەڵکی بکەین بۆ لااله الاالله .

3) لااله الا الله هۆکارە بۆ سەرفرازبوون و سەرکەوتن له دونیا و قیامەت .

4) پێداگری ســووربونی پێغەمبەرﷺ لەســەر وتنی ئەم وشــەیە له بانگەوازی کردن بۆ بەتاک پەرستنی الله تعالى لەهەموو عیباداتەکان دا .

[2] [ابن حزم | المصدر : المحلى – الرقم: 112/9]

5 ئامۆژگاری کردنی خەڵکی بەو وشـــە گەورەیە کە گەر کەســـێک بیڵێت و ئەنجامی بدات و کاری پێبکات ئەوە سەر فراز دەبێت .

6 بانگەشە کردنی خەڵکی بانگەوزکردنیان لە شوێنە گشتیەکان وەک بازاڕ و کۆڕ و کۆبونەوە جێگاکانی تر .

## فەرموودەی سێیەم

قال ابو سعيد الخذري قال رسول الله ﷺ الإيمانُ بضعٌ وسبعونَ شُعبةً أرفعُها لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وأدناها إماطةُ الأذى عنِ الطَّريقِ .[3]

واتا ; باوکی سعید ـــی خذری فەمووی : پێغەمبەر ﷺ فەمووی : ئیمان حەفتا و هەندێک بەشە ، بەرزترینیان لااله‌الاالله ـــیە ، وە نزمـــ ترینیان لابردنی ناڕەحەتی لەسەر ڕێگایە .

### چەند سودێک لەم فەرموودەیە

1 گەورەیی وشەی لااله الا الله دەردەخات لەدینی ئیسلام دا .

2 ئیمان بەش بەشە و زیاد و کەم دەکات .

[3] [ المصدر : مجمع الزوائد الصفحة أو الرقم: 42/1 | خلاصة حكم المحدث : رجال إسناده مستورون | انظر شرح الحديث رقم 120797]

(3)بەرزترين مەرتەبەى ئيمان لااله‌الاالله ـيە وە گەورەترينيانە .

(4)نزم ترين مەرتەبەى ئيمان لابردنى نارِحەتيە لەسەر رِێگا .

(5) بەڵگەيە كە ئيمان قەول و عمل و اعتقاد ــە چونكە لابردنى نارِەحەتى لەسەر رِێگا ئەوە پێويستى بە جوڵانى لاشە هەيە واتا پێويستى بە عمل ــە وە ئەو عمل ـەش لە مەرتەبەى ئيمانە وەگەر كەسێك ئەو كارە ئەنجام نەدات ئەوە مەرتەبەيێكى نيە لە مەرتەبەكانى ئيمان . وە وڵامێكە بۆ ئەهلى ارجاء .

(6)گەورەيي كار ئاسانى كردن لەسەر خەڵكى كە يەكێكە لە مەرِتەبكانى ئيمان وەك لابردنى نارِەحەتى لەسەر رێگاى خەڵكى .

(7)ئيمان بە كردەوەش زياد و كەم دەكات .

## فەرموودەى چوارەم

قال جرير بن عبدالله قال النبى ﷺ : « بُنِي الإسلامُ على خمسٍ شهادةِ أن لا إلهَ إلَّا اللهُ وإقامِ الصَّلاةِ وإيتاءِ الزَّكاةِ وحجِّ البيتِ وصومِ رمضانَ »[4]

[4] [المصدر : مجمع الزوائد-الصفحة أو الرقم: 52/1 | خلاصة حكم المحدث : إسناد أحمد صحيح]

واتا : جەریر ی کوڕی عبدالله فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئیسلام لەسەر پێنج پایەیە ، یەکەم شایەتی دان بەوەی کەهیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرســـتن بێت بەحق تەنها الله تعالی نەبێت ، دووەم ئەنجامدانی نوێژ[نوێژە فەڕزەکان]، ســێیەم زەکات بەخشـــین ، چوارم ئەنجامدانی حەج[حەج ـــــی فەڕزکراو]، پێنجەم بەڕۆژو بوون لە مانگی ڕەمەزاندا .

## |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

(1) گەورەیی وشەی لاالە الاالله دەردەخات.

(2) لاالەالاالله یەکەم پایەی ئیسلامە وە گەورەترینیانە .

(3) مرۆڤ تا مەلکەچ نەبێت بۆ دان پێدانان بە لاالەالا الله ئەوە هیچ کردەوەیکی تری لێ قبوڵ ناکرێت .

(4) مرۆڤ بەوتنی ئەم وشەیە و کارکردن پێی و بەڕاست زانینی دەبێتە موسڵمان و دێتە ناو بازنەی ئیسلامەوە وە وە بەموسڵمان هەژمار دەکرێت لە ڕۆکەشدا .

(5) هەرکەسێک تاوەک و دان بەو وشەیە دانەنێت ئەوە موسڵمان نیە و نەهاتوتە ناو دینی ئیســـلام ، ئەگەر چی هەموو جوڕە عیبادەتەکانی تربکات، وەک لەم ســەردەمەدا کەســانێک هەن کە مانای ئەوشــەیە نازانن کارێ پێ ناکەن بەڵام نوێژ و ڕۆژ و عیباداتەکانی تر دەکەن .

(6) بەڵگەیە لەسەر هەبوونی نوێژ و زەکات و حەج و ڕۆژوی ڕەمەزان .

## |فەرموودەی پێنجەم|

قال أبو هريرة قال النبي ﷺ : «جدِّدوا إيمانَكم قيل يا رســولَ اللهِ وكيف نُجَدِّدُ إيمانَنا قال أَكثِروا مِن قولِ لا إلهَ إلَّا اللهُ .» [5]

واتا ; باوكى هريرة فەرمووى : پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵەكانى فەرمووى : «ئيمانتان تازە بكەنەوە [نوێ بكەنەوە] ، هـاوەڵەكان فەرموويان چۆن ئيمانـمان تازە بكەينەوە ئەی پێغەمبەر ﷺ ؟،، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى زۆر وشــەی لااله الاالله بلێينەوە «.

### |چەند سودێک لەم فەرموودەيە|

1 گەورەيي وشەی لااله الاالله دەردەخات.

2 ئيمان كۆن دەبێت و لاواز دەبێت .

3 كەسی موسوڵمان پێويستە ئيمانی خۆی تازە بكاتەوە .

4 پێغەمبەر ﷺ ئـاگـادارمـان دەكات بەوەی خەمی ئيمانـمان بێـت و تازەی بكەينەوە .

---

[5] [المصدر : مجمع الزوائد |الصفحة أو الرقم: 85/10 | خلاصة حكم المحدث : رجال أحمد ثقات ]التخريج : أخرجه أحمد (8695) واللفظ له، وعبد بن حميد في ((مسنده)) (1422)، والبزار (9569) باختلاف يسير.]

5 لاالەالا الله هۆکارە بۆ تازە بونەوەی ئیمان .

6 گرنگی و گەورەی  زۆر دووبارە کردنەوەی وشەی لااله الاالله .

تێبینی . مەبەســـت لەتازەکردنەوەی ئیمان ئەوەیە کە پاک و خاون و تازە کردنەوەی ئیمانە و تازەکردنەوەتی بۆ بەهێز بونی ئیمان !!. نەک موسڵمان بونەوە .

## فەرمموودەی شەشەم

قال النعمان بن بشـير قال النبى ﷺ : «أُمِرْتُ أن أُقاتِلَ النَّاس حتَّى يقولوا لا إلهَ إلَّا اللهُ فإذا قالوها عصَموا منِّي دماءَهم وأموالَهم إلَّا بحقِّها.» [6]

واتا ; نعمانی کوڕی بەشـــیر فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :« فەرمانم پێکراوە خەڵکی بکوژم هەتا ئەوکاتەی دەڵێن هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها  الله تعالى نەبێت ، جائەگەر وایان وت ئەوا خوێن و ماڵیان لە من حەڕام دەبێت  تەنها بەحەقی خۆی نەبێت . [واتا ناتوانم بینان کوژم مەگەر کافر ببنەوە یان کارێک بکەن کە حوکمیان کوشـــتنیان بێت وەک زیناکردن کە حوکمی

[6] [المصدر : مجمع الزوائد | الصفحة أو الرقم: 31/1 | خلاصة حكم المحدث : رجاله رجال الصحيح | انظر شرح الحديث رقم 75056]

کوشـتنە یان بەناحەق کوشـتنی موسـڵمان یان هاوڕەگەز بازی یان هەر بابەتێکی تر کە حوکمیان کوشتن بێت بۆ خاوەن کارەکە.»

## چەند سودێک لەم فەرموودەیە

1) گەورەیی وشەی لاالە الاالله دەردەخات کە جیهادی لە پێناو دەکرێت .

2) کوشتنی خەڵکی کافر تا ئەوکاتەی کە موسڵمان دەبن .

3) ماڵ و خوێنی کەسێک حەڕام نیە بۆ موسڵمانان کە هێشـتا موسڵمان نەبووە و شەیتمانی نەهێناوە .

4) لاالە الا الله دەبێتە ڕێگر لە کوشتنی موسڵمانان بەبێ حەقی خۆی .

5) پێغەمبەر ﷺ جیهـاد لە هەواو هەوەسی خۆی ناکات بەڵکو الله تعـالی فەرمانی پێکردوە بۆ جیهاد کردن .

6) بەردەوام بوون لە جیهاد تا هەموو خەڵکی سەر زەوی دەبێت بە موسوڵمان .

تێبنی : ئەم فەرموودەیە ئەهلی کتاب ناگرێتەوە ئەگەر جزیە بدەن .

## فەرمودەی حەوتەم

قال رســـول الله ﷺ: «فَإِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ .» [7]

واتا ; پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : «بەڕاســـتی الله تعالی دۆزەخی حەڕام کردوە لەسەر ئەو کەسەی کە بڵێت هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، وە بەو شێوەش گەیشتبێت بە ڕوی الله [واتا بە لیقای الله ].»

## |چەند سودێک لەم فەرموودیە|

1. گەورەیی وشەی لاالەالاالله دەردەخات .
2. بەڵگەیە لەسەر هەبونی ئاگری دۆزەخ .
3. بەڵگەیە لەسەر هەبوونی ڕۆژی قیامەت و گەڕانەوە بۆ لای الله تعالی .
4. بەڵگەیە کە کەسی موسڵمان بە لیقای الله تعالی شاد دەبێت .
5. کەسێک کە لاالە الا الله ــــی نەبێت . دۆزەخی لێ حەڕام ناکرێت و ناچیتە بەهەشەوە .

[7] [رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ]

6 گەر کەسـێک هەر چەندە لە دونیادا ئەو وشـەی وتبێت ، بەڵام لەسـەری نەمردبێت و شـیرکی بڕیار دابێت ئەوە ناچیتە بە هەشـتەوە و دۆزەخی لەسـەر حەڕام ناکرێت ، چونکە دەبێت لەسەری مردبێت .

7 لاالەالا الله هۆکارە بۆ ئەوەی کە کەسی موسـڵمان بەهۆیەوە ئاگری دۆزەخی لەسەر حەڕام دەکرێت .

## |فەرموودەی هەشتەم|

قال رسـول الله ﷺ : «أَبشِروا ، و بَشِّروا مَن وراءَكم ، أنه مَن شـهِد أن لا إلهَ إلا اللهُ صادقًا دخل الجنَّةَ .»[8]

واتا ; پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : «موژدە بدەن بەوانەی دوای خۆتان ، موژدە بدەن بەوانەی دوای خۆتان ، بەدڵنیایەوە هەر کەسـێک ڕاسـتگۆیانە شـایەتی بدات کە هیچ پەرستراوێک نیە شـایەنی پەرسـتن بێت بەحەق تەنها الله نەبێت، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە .»

### |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

[8] [ المصدر : السلسلة الصحيحة|الصفحة أو الرقم: 712 | خلاصة حكم المحدث : إسناده صحيح على شرط مسلم | التخريج : أخرجه أحمد (19612) واللفظ له، والطحاوي في ((شرح مشكل الآثار)) (4003)

①گەورەیی وشـــەی لااله‌الا الله دەردەخات کە کەسی موســـڵمان بە هۆیەوە دەچێتە بەهەشتەوە .

②موژەدان بە موسڵمان و دڵخۆش کردیان بە هەواڵێ خۆش و ڕاست .

③مەرجێک لە مەرجەکانی لااله‌الاالله ئەوەیە کە ڕاســـت گۆیانە بڵێت لااله الا الله .

④دڵسۆزی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئومەتەکەی خۆی .

## فەرموودەی نۆیەم

عَنْ أَبِي مَالِكٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، قَالَ : سَمِعْتُ رَسُـولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ : «يَقُولُ مَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مَنْ دُونِ اللَّهِ ، حَرُمَ مَالُهُ ، وَدَمُهُ ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ.» [9]

واتا ; لە باوکی مالیک ـــــەوە ، ئەویش لە باوک ــــیەوە فەرمووی بیسـتم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو : «هەر کەسێک بڵێت ، هیچ پەرستراوێک نیە شـایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها  الله تعالى نەبێت ، وە بێباوڕ بێت بەوەی لەغەیری الله

[9] [صحيح مسلم | حديث رقم 63 | كِتَابُ الْإِيمَانَ]

تعالی دەپەرستریێت ، ئەوکات ماڵ و سامان و خوێنی لەسەر موسڵمانان حەڕام دەبێت ، وە حیساب و لێپرسێنەوەی لەسەر الله تعالی یە .»

## |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

(1) گەورەیي وشەی لااله الاالله دەردەخات .

(2) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە وتنی لااله الا الله بەتەنها تەواو نابێت بەڵکوو دەبێت لەگەڵ ئەوش دا بێباوڕ بێت بەوەی لە غەیری الله تعالی دەپەرستریێت .

(3) ماڵ و خوین بە وشەی لاالهالاالله حەڕام دەبێت لەسەر موسڵمان .

(4) ئەوبەشەی کە دەفەرمویت وکفر بما یعبد من دون الله ، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەیەکێک لە مەرجەکانی لااله الاالله . کە بێ باوڕ بونە بەوەی کەلە غەیری الله تعالی دەپەرستریێت .

~ تێبینی ; وشەی لااله .واتا ; نەفی کردن و قبوڵ نەکردنی پەرستراوە باطڵەکانە بۆ پەرستن. و وکفر بما یعبد من دون الله . واتای : بێباور بونە بە پەرستراوە باطلەکان .

## |فەرموودەی دەیەم|

عن جابر بن عبد الله رضي الله عنه قال : سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول : «أَفْضَلُ الذِّكْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ الحَمْدُ لِلَّهِ .» [10]

واتا ; لە جابری کوری عبدالله ـوە الله تعالى لێی ڕازبێت فەرمووی : بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو : «گەورەترین زیکر وشـــەی لااله الاالله ـــــــیە ، وە گەوەرەترین دوعاء الحمدلله یە .»

## چەند سودێک لەم فەرموودەیە

1. گەورەیی وشەی لااله الا الله دەردەخات کە بەرزترین پلەی پێبەخشراوە.
2. وا لە کەسی موسوڵمان دەکات کە زۆر ئەم وشـەیە دووبارەی بکاتەوە چونکە گەورەترین زیکرە .
3. وشەی الحمدلله بریتیە لە دوعاء وە گەرەترین دوعا یـە .

## فەرموودەی یانزدە

عن عثمان رضي الله عنه قال: قال رسـول الله صـلى الله عليه وسـلم : «مَن ماتَ وهو يَعْلَمُ أنَّه لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، دَخَلَ الجَنَّةَ.» [11]

[10] [راوه الترمذی وحسنه الألبانی]

[11] [ المحدث : مسلم | المصدر : صحيح مسلم | الصفحة أو الرقم: 26 | خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

واتا ؛ له عوســـمان ــــــــه وه [الله لێی ڕازیبێــت] فەرمووی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : «هەر کەســـێک مرد و لەگەڵ ئەوەش دا زانســـتی هەبوو بەوەی کە هیچ پەرسـتراوێک شـایەنی پەرسـتن بێت نیە بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، ئەوە دەچیتە بەهەشتەوە .»

## |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

(1) گەورەیی وشەی لااله الا الله دەردەخات .

(2) هۆکارە بۆ چوونە بەهەشـــتەوە ئەگەر چی خـاوەنەکەی خـاوەنی گوناهە گەورەکان بێت . بەڵام لە دوای لاچونی سزای گوناهەکانی دەچێتە بەهەشتەوە .

(3) بەڵگەیە لەســـەر ئەوەی کە یەکێـک لە مەر جەکانی قبوڵبونی لااله الا الله ئەوەیە کە علم و زانست بە مان و داواکاریەکانی هەبێت و کارت پێی کردبێت

(4) مەرج نیە هەر کەســـێک وتی لااله الا الله و بمرێت بچێتە بە هەشـــتەوە . بەڵکوو دەبێت علم و زانستی بەو وشەیە گەورە و بەڕێزە هەبێت .

## |فەرموودەی دوانزدە|

عن ابو هريرة قال. قال رسـول الله ﷺ : «أشـهَدُ أنْ لا إلهَ إلَّا اللهُ ، و أنِّي رسولُ اللهِ ، لا يلْقَى اللهَ بِهِما عبدٌ غيرُ شاكٍّ فِيهِما إلَّا دخَلَ الجنةَ». [12]

---

١٢ [ المحدث : الألباني | المصدر : .صحيح الجامع | الصفحة أو الرقم: 1009 | خلاصة حكم المحدث : صحيح | التخريج : أخرجه مسلم (27)]

واتا ; لە باوکی هورەیرەوە [ الله لێی ڕازیبێـت ] فەرمووی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : «بەندە شایەتی بدات کە هیچ پەرستراوەێک شایەنی پەرستن نیە بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، وە شایەتی بدات کە من [واتا محمد ﷺ] نێردراوای الله تعالی ـــــیە ، بگات بە لیقای الله تعالی وە هیچ شک و گومانێکی لەم دوو شایەتیە نەبێت . الا دەچیتە بەهەشتەوە .»

## چەند سودێک لەم فەرموودیە

(1) گەورەیی وشەی لاالە الا الله و محمد رسول الله دەردەخات .

(2) لاالە الا الله و محمد رسول الله هۆکارە بۆ چوونە بەهەشتەوە .

(3) شـایەتی دان بە لاالە الا الله قبوڵ نابێت بەبێ شـایەتی دان بە محمد رسـول الله ،

(4) نابێت بەندە شکی لەو دوو شـایەتەیە هەبێت، چونکە شـک دژی یەقینە و دڵنیاییە .

(5) هەر کەسـێک شـەکی لەو دوو شـایەتیە هەبێت ئەوە لێی قبوڵ ناکرێت وە ناچێتە بەهەشتەوە .

(6) بەڵگەی لەسەر ڕاستی و هەبوونی ڕۆژی قیامەت .

(7) بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی بەهەشت .

## |فەرموودەی سێزنزە|

عن ابی ذر قال رســـول الله ﷺ : «ما مِن عَبْدٍ قالَ: لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ مَاتَ علَى ذلكَ إِلَّا دَخَلَ الجَنَّةَ قُلتُ: وإنْ زَنَى وإنْ سَرَقَ؟ قالَ: وإنْ زَنَى وإنْ سَرَقَ،..» [13]

واتا ; لە باوکی ذز ـــــــە وە پێغەمبەرﷺ فەرمووی : «هیچ بەندەیێک نیە بڵێت ، هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، پاشان لەسەر ئەو حاڵە [واتا بەو شایەتیەوە مرد] ئیلا دەچیتە بەهەشتەوە ، وتم . ئەگەر کەسەکە زیناش بکات و دزیش بکات؟؟.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەگەر زیناش بکات و دزیش بکات. ...»

### |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

(1) گەورەیی وشەی لاالە الا الله دەردەخات .

(2) بەڵگەیە لەســەر ئەوەی کە کەسـێک خاوەنی گوناهە گەورەکانیش بێت ئەوە هەر دەچیتە بەهەشتەوە ، جائەگەر الله تعالی بە فضل و منەتی خۆی لێی خۆش بێت ، یان لە دوای تۆڵە لێکردنەوەی بە ئاگری دۆزەخ بیخاتە بەهەشت .

[13] [أخرجه البخاري (5827)، ومسلم (94)]

③ ڕەدێکی بەهێزە بۆ ئەوکەسانەی کە دەڵێن گەر کەسێک گوناهێکی گەورەی کرد پێ کرافر دەبێت. ڕەدەکەش لەوە دایە چۆن زیناکار و دز دەچەنە بەهەشـتەوە ئەگەر بەزینا و دزیەکەیان کافر بوو بن !؟؟،

④ بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی بەهەشت .

## فەرموودەی چواردەیەم

حدثني معاذ عن النبي ﷺ قال : «ما مِن نَفسٍ تَموتُ تشـــهَدُ أن لا إلَه إلَّا اللَّهُ وأنِّي رسـولُ اللَّهِ صـلَّى اللَّهُ عليهِ وسـلَّمَ يرجِعُ ذلِك إلى قلبِ موقنٍ إلَّا غفَرَ اللَّهُ لَها» [14]

واتا ; معاذ بۆی گێڕاینەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : «هیچ نەفسێک نیە بمرێت و شـایەتی دابێت بەوەی هیچ پەرسـتراوێک نیە شـایەنی پەرسـتن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، وە من [محمد ﷺ ] . نێردراوی الله تعالی ـــم ، وە گڕابێتەوە بۆلای الله تعالی وە دڵنیابێت لەســەر ڕاســتی ئەوە شــایەتیە [واتا یەقینی هەبێت بەوەی کە تەنها الله شــایەنی پەســتنە بەحەق وەمحمد ـــــــیش نێردراوای الله تعالی یە]. ئیلا الله تعالی لێ خۆش دەبێت.»

## چەند سودێک لەم فەرموودیە

[14] [المحدث : الألباني | المصدر : صحيح ابن ماجه الصفحة أو الرقم: 3078 | خلاصة حكم المحدث : حسن صحيح / التخريج : أخرجه النسائي في ((السنن الكبرى)) (10975)، وابن ماجه (3796) واللفظ له، وأحمد (21998)]

1 گەورەیي وشەی [لااله الا الله و محمد رسول الله ] دەردەخات .

2 بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی گەڕانەوە بۆ لای الله تعالی .

3 بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەیەکێک لە مەرجەکانی لااله‌الا الله ئەوەیە کە دەبێت یەقینت هەبێت بەو شایەتی دانە .

4 لااله‌الا الله هۆکارە بۆ لێخۆش بوون لە قیامەت .

5 بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی بەهەشت .

## فەرمووده پانزه

جَابِرَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَهُ فَقَالَ: «اذْهَبْ فَنَادِ فِي النَّاسِ أَنَّ مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُوقِنًا أَوْ مُخْلِصًا فَلَهُ الْجَنَّةُ» [15]

واتا ; جابر [ الله تعالی لێی ڕازیبێت ] پێغەمبەر ﷺ : جابر ی ناردی و پێی پێی فەرموو «بڕۆ بۆ ناو خەڵک و بانگ بکە و بڵێ هەرکەسـێک شـایەتی بدات بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، بە یەقینەوە [بەدڵنیایەوە] یان بە دڵسـۆزیەوە ، ئەوە بە هەشـتی بۆ هەیە [واتا دەچێتە بەهشتەوە].»

[15] [رواه ابن خزيمة في التوحيد، وصححه ابن حبان]

## چەند سودێک لەم فەرموودەیە

(1) گەورەی وشەی لااله الا الله دەردەخات .

(2) ڕۆیشتنی بانگەواز کار بۆ بانگەوازییەکەی .

(3) لەکاتی بانگەوازی کردن دا بچیت بۆ لای زۆینەی خەڵکی گەرمتوانیت .

(4) لااله الا الله هۆکارە بۆ چوونە بەهەشتەوە .

(5) مەرجێک لەمەرجەکانی قوڵبونی لااله‌الا الله یەقین و دڵنیابوونە لە مانای لااله الاالله .

(6) مەرجێک لە مەرجەکانی قبوڵبونی لااله الاالله اخلاس و دڵسوزیە .

## فەرموودەی شانزە

قال النبی صلى الله عليه وسلم لأبي هريرة رضي الله عنه: «...مَنْ لَقِيتَ مِنْ وَرَاءِ هَذَا الْحَائِطَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ مُسْتَيْقِنًا بِهَا قَلْبُهُ، فَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ» [16]

واتا ؛ پێغەمبەر ﷺ بە باوکی هریرە ـــــی فەرموو : «.. گەیشتیت بە هەر کەسێک لە پشت ئەو دیوارەوە شایەتی دا بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی

[16] [رواه مسلم]

پەرسـتن بێت بەحەق تەنها  الله تعالى نەبێت ، وە دڵی دامەزاوبوو بەو شـيايەتيه ، ئەوەی موژدەی بەهەشـتی پێبدە .»

## چەند سودێک لەم فەرموودەيە

(1) گەورەيي وشەی لاالەالا الله دەرەخات .

(2) يەكێک لەمەرجەكانی  قبوڵبونی لااله الاالله بەردەوامبونە لەسـەر ئەو شـايەتييە بەدڵ و بە وتە و كردەوە .

(3) موژدە دانی بەهەشت بەكەسێ موسڵمان كە خاوەنی لاالەالا الله .

(4) دڵسـوزی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئومەتەكەی  بەوەی كە دڵيان خۆش بكات بە چوونە بەهەشت بە هۆی لااله الاالله .

## فەرموودەی حەڤدە

عن ابن عباس رضي الله عنه أن النَّبِيّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ قال: «لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ شِهَادة أن لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ؛ فَمَنْ قَالَهَا عِنْد مَوته وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ». [17]

واتا ; لە كوری عباس ـــــەوە [ الله تعالى لێی ڕازيبێت] پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : «مردووەكانتان تەلقين بدەن بەشـايەتی دان لااله الا الله [مەبەسـت لە

[17] [راوه المسلم]

کاتی مردنە لەکاتی ڕوح دەچونە] جا هەرکەسێک ئەوەی وت لەکاتی سـەرەمەگیدا ئەوە (الله تعالی پێویستی دەکات) کە بیخاتە بەهەشتەوە»

## |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

(1)گەورەیی وشەی لااله‌الاالله دەردەخات .

(2)بەبیر هێنانەوەی وشەی لااله الاالله لە کاتی سەرمەرگ دا .

(3)واجب بونی چوونە بەهەشت بۆ ئەو موسڵمانەی لەسەرە مگدا وشەی لااله الا الله دەڵێت .

(4)تەڵقیندان لە پێش مردنە نەک دوای مردن .

## |فەرمووده‌ی هەژده|

عن معاذ بن جبل قال . قال رسول الله ﷺ : «من كان آخرَ كلامِه من الدنيا لا إلَهَ إلا اللهُ دخل الجنةَ». [18]

واتا : لە معاذ ــــــــەوە فەرمووی پێغەمبەری الله ﷺ فەرمووی : «هەر کەسێک ئاخر وشەی لە دونیا ئەوبێت کە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت . ئەوە ئیلا دەچێتە بەهەشتەوە .»

[18] [راوه الإمام أحمد و ابو داود والحاكم وصحيحه الألبانی]

## چەند سودێک لەم فەرموودەیە

1 گەورەيي وشەی لااله‌الا الله دەردەخات .

2 ئامۆژگارییە بۆ کەسی موسـڵمان دەکات کە زۆر ئەو وشــەیە دووبارە بکاتەوە تاوەکو مرد لەسەر ئەو وشەیە بمرێت بۆ ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە

3 هەر موسڵمانێک لە دونیا دەرچوو وە ئاخر وشـەی کە لە دونیادا لااله الاالله بو ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە بإذن الله.

# فەرموودەی نۆزدە

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قال . قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : «... أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ أَوْ نَفْسِهِ.» [19]

واتا ; لە باوکی هریرە ــەوە فەرمووی پێغەمبەرـی الله ﷺ فەرمووی : «ئەو کەسە سەر دەکەوێت لە خەڵکی بە شـەفاعەتی من کە بڵێت هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالى نەبێت ، بە دڵسوزانە لە دڵییەوە یان لە نەفسی خۆیەوە .»

## چەند سودێک لەم فەرموودەیە

[19] [راوه البخارى . الجزء رقم :1، الصفحة رقم:31]

(1)گەورەیی وشەی لاالە الا الله دەردەخات .

(2)بەڵگەیە لە ڕاستی و هەبوونی شەفاعەت لە ڕۆژی قیامەت .

(3)بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی ڕۆژی قیامەت

(4)ڕەدێکە بۆ خەواریجەکات کە ئنکاری هەبوونی شـــەفاعەت دەکەن لە ڕۆژی دوای .

(5)شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ تەنها کەسی موسڵمان دەگرێتەوە کە خاوەنی وشەی لاالە الاالله ـیە .

(6)لاالەالا الله هۆکارە بۆ کەوتنە بەر شەفاعەت ی پێغەمبەر محمد ﷺ .

## فەرموودەی بیستەم

عن انس بن مالک قال رســولُ اللهِ صــلَّى اللهُ عليه وســلَّم لمعاذِ بنِ جبلٍ : «اعلَمْ أنه مَن شهِد أن لا إلهَ إلا اللهُ دخَل الجنةَ.» [20]

واتا لە ئەنس ـــی کوڕی مالیک ـەوە [ الله تعالى لێی ڕازیبێت] پێغەمبەر ﷺ بە معاذ ــــــی فەرموو : «بزانە هەر کەســێک شـــایەتی دا بەوەی هیچ

[20] [| المحدث : البوصيري | المصدر : إتحاف الخيرة المهرة | الصفحة أو الرقم: 69/1 | خلاصة حكم المحدث : إسناده صحيح على شرط مسلم]

پەرســـتراوێک نيە شــايەنى پەرســـتن بێت بەحەق تەنها الله تعالى نەبێت ، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە .»

## |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

1) گەورەيي وشەی لااله الاالله دەردەخات

2) علم و زانست بەخشێنەوە بەخەڵک .وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ زانسـتی بە معاذ فەرموو .

3) لااله الا الله هۆکاری چوونە بەهەشتەوە .

4) بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی بەهەشت .

## |فەرموودەی بیست و یەک|

عن عبدالله بن عمرو عن النبی ﷺ قال : «ما علَى الأرضِ أحدٌ يقولُ : لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ واللَّهُ أَكْبرُ ولا حولَ ولا قوَّةَ إلَّا باللَّهِ ، إلَّا كُفِّرَت عنهُ خطاياهُ ولو كانت مثلَ زبدِ البحرِ.» [21]

[21] [المصدر : صحيح الترمذي | الصفحة أو الرقم: 3460 | خلاصة حكم المحدث : حسن | التخريج : أخرجه الترمذي (3460) واللفظ له، والنسائي في ((عمل اليوم والليلة)) (124)، وأحمد (6479)]

واتا : لە عبدالله ـــی کوڕی عمر ـــەوە ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : «کەسـێک لەسـەر زەوی نیە بڵێت هیچ پەرسـتراوێک نیە شـایەتی پەرسـتن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، وە الله گەورەترینە ، وە هیچ هێز و توانایک نیە ئیلا بە دەست الله تعالی یە ، ئیلا گوناهـ و تاوەنەکانی ڕەش دەبێتەوە ئەگەر چی هاوشێوەی کەفی دەریا بێت ،»

## |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

1. گەورەیی وشەی لاالە الاالله دەردەخات .
2. گەوەریی وشەی الله اکبر دەردەخات .
3. گەوریی وشەی لا حول ولا قوة الا بالله دەردەخات .
4. لا اله الا الله هۆکارە بۆ ڕەش بونەوەی گوناهەکانی مرۆڤ .
5. بی ئومێد نەبونی کافران و موسڵمانان لە تۆبە کردن ،وە نەبونی گومانی موسڵمان لە ڕەحمەت و مەغفیرەتی الله تعالی .

# |فەرموودەی بیست ودوو|

عن انس ابن مالك عن النبى ﷺ قال :« يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَن قالَ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، وفي قَلْبِهِ وزْنُ شَـــعِيرَةٍ مِن خَيْرٍ، ويَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَن قالَ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، وفي

قَلْبِهِ وزْنُ بُرَّةٍ مِن خَيْرٍ،ويَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَن قالَ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، وفي قَلْبِهِ وزْنُ ذَرَّةٍ مِن خَيْرٍ. »[22]

واتا : لە ئەنەس ـــی کوڕی مالك ـــەوە ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : ئەوکەســـە دەردەچێت لەئاگر بڵێت لاالە الاالله وە لە دڵیدا بە ئاندازەی دنکە جۆ ـــێک خێر هەبێت ، وە ئەوکەسە دەردەچێت لە ئاگر کە بڵێت لاالە الاالله وە لە دڵیدا بە ئەندازەی دنکە گەنم ـــێک خێر هەبێت ، وە ئەوکەسـە دەردەچێت لە ئاگر کە بڵێت لاالە الاالله وە لەدڵیدا بەئەندازەی سەنگی گەردیلەیک خێر هەبێت .

لەم فەرموودەیە، خێر واتا ئیمان ، کما قال ﷺ ،

## |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

(1) گەورەیی وشەی لاالە الاالله دەردەخات .

(2) دەرچونی ئەو کەسەی کە خاوەنی لاالە الاالله یە لە ئاگری دۆزەخ .

(3) بەڵگەیە کە کەسی موســـڵمان دەچێتە ئـاگری دۆزەخەوە بە هەهۆی گوناهەکانیەوە لەبەر ئەوەی ﷺ دەفەرمووێت{يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ} .

(4) بەڵگەیە کە کەسی موســـڵمان لە ئاگری دۆزەخ نامێنێتەوە ئاگەر چی چەندین گوناهی گەوەرەی کردبێت وەک زیناو دزی وەئەوانەی تریش لە گوناهەکان .

[22] [أخرجه البخاري (44)، ومسلم (193)]

## |فەرموودەی بیست و سێ|

جَعَلَ النَّبِيُّ صـلى الله عليه وسـلم : «عِنْدَ مَوْتِهِ يُدْخِلُ يَدَيْهِ فِي الْمَاءِ فَيَمْسَـحُ بِهِمَا وَجْهَهُ، وَيَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ.» [23]

واتا : پێغەمبەرﷺ «لە کاتی سـەرە مەرگیدا دەسـتەکانی دەکردە ناو ئاوەوە و دەم و چاوی پێ دەسڕی و دەفەرموو هیچ پەرستراوێک نییە شایسـتەی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالى نەبێت.بەڕاستی مردن نارەحەتی و ئازاری هەیە .

### |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

1 گەورەیی وشەی لاالە الاالله دەردەخات .

2 گرینگی دان بەو وشەیە گەورە و مەزانە ئەگەر لە کاتی سەرمەرگیشدا بێت .

3 مرۆڤی موسـلْمان لەکاتی سـەرمەرگدا توشی نارەحەتی و ئازار دێت وەک ﷺدەفەرموێت (إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ) .

4 کەسی موسـلْمان لاشـەی گەرم دەبێت بەتایبەتی ڕۆخسـاری وەک پێغەمبەر ﷺ کە ئاو بە ڕۆخساری دادەکات .

## |فەرموودەی بیست و چوار|

عن البراء بن عازب رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال :

---

[23] [البخاری مع الفتح برقم¦ ١٤٤/٨]

إِذَا أُقْعِدَ الْمُؤْمِنُ فِي قَبْرِهِ أُتِيَ، ثُمَّ شَـــهِدَ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وأَنَّ مُحَمَّدًا رَســـولُ اللَّهِ، فَذلكَ قَوْلُهُ: {يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بالقَوْلِ الثَّابِتِ} [إبراهيم: 27] .

واتا : لە بەراء ــی کوڕی عازب [الله تعالی لێی ڕازیبێت] لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : کاتێک ئیماندار لە ناو گورەکەی دانیشـــێدرا دێت ، پاشـــان شـــایەتی دەدات بەوەی لاالە الاالله و محمد رسـول الله ، وەئەمە ئەو وتەیەیە { الله تعالی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەکات لەســـەر گوفتاری بەجێ و دروســـتیان لە ژیانی دنیادا،}»

## |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

(1)گەورەیی وشەی لاالە الاالله دەردەخات .

(2)لاالە الا الله هۆکارە بۆ دامەزراوی خاوەنەکەی لە ناوگۆڕدا لە کاتی پرســـیار لێکردن دا.

(3)بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی پرسیارەکانی ناو گوڕ .

(4)کەســێک لە ژیانی دونیای دا لەســەر ئەم وشــەیە دامەزراو پێداگر نەبێت . ئەوا لە گوڕیشدا دامەزراو نابێت .

## |فەرموودەی بیست و پێنج|

عبدالله بن عمرو (رض) قال: قال رسـول الله (صـلى الله عليه وسـلم): «أن الله سـيخلص رجلا من أمتى على رؤوس الخلائق يوم القيامه. فينشر ـ له تسـعه وتسـعين سجلا,كل سجل مثل مدّ البصر ـ ثم يقول: أتنكر من هذا شـيئا ؟ أظلمتك كتبتى الحافظون ؟ فيقول: لا يارب, فيقول: أفلك عذر ؟ فيقول: لا يارب, فيقول: بلى. إن لك حسـنه: فإنه لا ظلم عليك اليوم, فتخرج بطاقه فيها: أشـهد أن لا إله إلا الله وأشـهد أن محمدا عبده ورسـوله, فيقول: احضر ـ وزنك, فيقول: يارب ما هذه البطاقه مع هذه السـجلات ؟ فقال: إنك لا تظلم, قال : فتوضع السـجلات فى كفه والبطاقه فى كفه, فطاشت السجلات وثقلت البطاطاقه, فلا يثقل مع اسم الله أحد «.[24]

واتا : عبدالله کوڕی عمر الله تعالى لە خۆی و باوکی رازیی بێت,دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: « الله تعالى لەبەر چاوانی هەموو بەدیهێنراوانی دا لەرۆژی دوایی دا پیـاوێـك لە نەتەوەکەمـدا هەڵـدەبژێرێ,نەوەدو نۆ تۆمـارگەی بۆ بڵاودەکاتەوە,هەر تۆمارێکیـان بە قەد ئەوەنـدەی کەچـاو پڕبکات پـان و پۆڕە بە نوســـین رەش کراوەتەوە ,{واتا نوسراوە بە نوســـینی ڕەش }پاشـــان الله تعالى دەفەرموێ: ئایا هیچ شتێ لەمە ئینکاری دەکەیت ؟ ئایا ئەو فریشتانەم کە کرداریان نوسینی و پاراسـتویانن هیچ سـتەمێکیان لێ کردویت (کە چاکەیەکیان پەراندبێ یان خراپەیەکیان زیادە یان گەورەتر نوسـیبێ) دەڵێ: نەخێر ئەی پەروەردگار. الله تعالى

[24] [رواه ابن ماجه والترمذى وقال حديث حسن غريب وصححه والإلبانى]

دەفەرموێ: دەی ئایا هیچ بیانووت هەیە؟ دەڵێ: نەخێر ئەی پەروەردگار. الله تعالی دەفەرموێ: با,تۆ تەنها چاکەیەکت هەیە, بێگومان ئەمڕۆ ستەمت لێ ناکرێ (چونکە ڕۆژی ڕەحم و دادپەروەری یە) لەم کاتەدا کارتێك دەردەکرێت تیایدا نووسراوە (أشـــهد أن لا إله إلا الله و أشـــهد أن محمدا عبده ورســـوله) ئینجا الله تعالی دەفەرموێ: ئیســـتا ترازووت بۆ دەهێنرێت.ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگار جا ئەو کارتە لە کوێ و ئەو هەموو تۆمارانە لەکوێ؟ الله تعالی دەفەرموێ: جا خۆ تۆ ســـتەمت لێ ناکرێ,ئینجا هەموو تۆمارەکان دەخرێنە تایەکی و کارتەکەش دەخرێتە تاکەی تریەوە ,تۆمارگەکان ســـووکەڵا دەبن و بەرز دەبنەوە و کارتەکەش قورس دەبێت و دەنیشـێت,چونکە هیچ شـتێ حەدی نی یە لەناوی الله تعالی قورس و سەنگین تر بێت.

## چەند سودێک لەم فەرموودەیە

1. گەورەیی وشەی لااله الا الله دەدەخات .
2. گەورەیی عەدالەتی الله تعالی لە بەرامبەر بەندەکانی دەردەخات .
3. بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی میزان لە ڕۆژی قیامەت .
4. بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی ڕۆژی قیامەت و زیندوو بونەوەی بوونەور
5. وشەی لااله الا الله ، بەبێ ، محمد رسول الله . قبوڵکراو نیە .

## فەرموودەی بیست و شەش

عن انس بن مالك ان رَســولُ اللهِ صَــلَّى اللَّهُ عليه وســلَّمَ « ... سَمِعَ مُؤذنا يقولُ: أَشْـهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ أَشْـهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقالَ رَسـولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: خَرَجْتَ مِنَ النَّارِ ..»[25]

واتا ; لە ئەنەس ـــى کوڕی مالک ـەوە پێغەمبەرﷺ گوێی لێبو بانگ بێژ دەفەرموو : «شایەتی دەدەم کەهیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، پێغەمبەری الله ﷺ فەرمووی : دەرچوو لە ئاگر .»

### چەند سودێک لەم فەرموودەیە

① گەورەیي وشەی لاالەالا الله دەدەخات .

② گەورەیي بانگدان دەردەخات .

③ لااله الاالله خاوەنەکەی لە ئاگری دۆزەخ دەردەکات .

## فەرموودەی بیست و حەوت

[25] [المصدر : صحيح مسلم | الصفحة أو الرقم: 382 ]

عَنِ ابْنِ مَسْـعُودٍ رضي الله تعالى عنه قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْـلِمٍ يَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وأَنِّي رَسُـولُ اللَّهِ، إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: الثَّيِّب الزَّانِي، والنَّفْس بِالنَّفْسِ، والتَّارِك لِدِينِهِ الْمُفَارِق لِلْجَمَاعَةِ.» [26]

واتا : لە ابن مسعود ـــــەوە الله لێی ڕازیبێت فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : «خوێنی موســڵمان حەڵاڵ نیە کە شــایەتی بدات هیچ پەرســتراوێک شـــایەنی پەرســـتن نیە بەحەق تەنها الله تعالى نەبێت. تەنها بە یەکێک لەم سـێدانەیە. بەوەی کە زینای لەســەر چەسـپاو بێت. یان بە لە تۆڵەی کوشـتنی کەســێکی موســـڵمان بە ناحەق . یان واز هێنان لە دین و جیابونەوەی لەکۆمەڵی موسڵمانان .»

## چەند سودێک لەم فەرموودەیە

1. گەورەیی وشەی لاالە الاالله دەردەخات
2. لاالە الا الله خوێنی خاوەنەکەی حەڕام دەکات ئیلا بەحەقی خۆی نەبێت .
3. بەڵگەیە لەســەر حەڵاڵ یەتی خوێنی ســێ جۆر کەس . زینا کرای محصـــن [هاوسەر دار] . کوشتنی بکوژی بەناحەق . کووشتنی مرتد [هەڵگەڕاوە لە دین]

## فەرموودەی بیست و هەشت

[26] [مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ]

معاذ رضي الله عنه قال: قال رسـول الله صـلى الله عليه وسـلم: «إذا سـألك أهل اليمن عن مفتاح الجنة فقل: لا إله إلا الله.» [27]

واتا : لە معاذ ــــی کوڕی جبل ـــەوە [الله لێی ڕازیبێت] فەرمووی : «پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووی : ئەگەر ئەهلی [خەڵکی] یەمەن پرســـیاریان لێ کردیت ســـەبارەت بە کلیلی دەرگای بەهەشـــت ، ئەوە پێیان بڵێ کە لاالە الا الله کلیلی دەرگای بەهەشتە .»

## چەند سودێک لەم فەرموودەیە

(1) گەورەیی وشەی لاالە الاالله دەردەخات .

(2) لاالە الاالله کلیلی دەرگای بەهەشتە .

(3) زانستی بە سود بە خیشن بە خەڵکی . وەک پێغەمبەرﷺ معاذ فێردەکات [الله لێی ڕازیبێت]

(4) بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە بە هەشت دەرگای هەیە .

## فەرموودەی بیست و نۆ

[27] [احمد | 242/5]

عن أبي هريرة رضي الله عنه: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: «مَن حَلَفَ مِنكُم فقالَ في حَلِفِهِ: باللَّاتِ والعُزَّى، فَلْيَقُلْ: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ،.» [28]

لە باوکی هریرة ـەوە [الله تعالی لێی ڕازیبێت] پێغەمبەرﷺ فەرمووی : «هەر کەســـێک لە ئێوە ســـوێندی خواد و وتی ســـوێند بە لات و عوزا ، ئەوا با بڵێت هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ».

## |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

(1) گەورەیي وشەی لاالەالا الله دەدەخات .

(2) سوێند خواردن بە غەیری الله تعالی شیرکە بۆیە پێویستە تەوحید بوترێتەوە لەدوای دا کە لااله الاالله یە .

(3) لااله الا الله کەفارەتی سوێند خواردنە بە غیری الله تعالی .

(4) ئامۆژگاری کردنی خەڵکی لە دەرچوون لە کاری خراپە بۆ کاری چاکە .

## |فەرموودەی سی |

[28] [متفق علیه]

عن ابى هريرة عن النبى ﷺ : «ما قال عبدٌ لا إلَهَ إلَّا اللهُ قطُّ مخلِصًــــا ، إلَّا فُتِحَتْ له أبوابُ السماءِ ، حتى تُفْضِيَ إلى العرشِ ، ما اجتُنِبَتِ الكبائرُ .» [29]

واتا : لە باوکی هريرة ـەوە الله لێی ڕازیبێت . لە پێغەمبەرەوە ﷺ : «هیچ بەندەیک نیە بە دڵســـۆزانە بڵێت هیچ پەرســـتراوێک نیە شـــایەنی پەرســـتن بەحەق تەنها الله تعالی نەبێت ، وە خۆی بە دوور گرتبێت لە گوناهە گەورەکان ، ئیلا دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە تا دەگات بە عەڕش .»

## |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

1. گەورەیي وشەی لااله الا الله دەردەخات .
2. بەڵگەیە کە مەرجێک لە مەرجەکانی لااله الا الله دڵسۆزیە .
3. لااله الاالله بە هۆی گەورەیي و ڕێزیوە دەرگاکانی ئاسمانێ بۆ دەکرێتەوە .
4. بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی عەڕش .
5. گرینگی خۆ دور گرتن لە گوناهە گەورەکان .

[29] [المصدر : صحيح الجامع .الرقم: 5648 | خلاصة حكم المحدث : حسن | التخريج : أخرجه الترمذي (3590)، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (10669)]

## |فەرمودەی سی|

عن البراء بن عازب رضي الله عنه عن النبي صـلى الله عليه وسـلم قال : إِذَا أُقْعِدَ الْمُؤْمِنُ فِي قَبْرِهِ أُتِيَ، ثُمَّ شَـهِدَ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وأَنَّ مُحَمَّدًا رَسـولُ اللَّهِ، فَذلكَ قَوْلُهُ: {يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بالقَوْلِ الثَّابِتِ} [إبراهيم: 27] [30]

واتا : لە بەراء ی کوڕی عازب [الله تعالی لێی ڕازیبێت] لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : کاتێک ئیماندار لە ناو گورەکەی دانیشێدرا دێت ، پاشان شایەتی دەدات بەوەی لاالە الاالله و محمد رسول الله ، وەئەمە ئەو وتەیەیە { الله تعالی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لە ژیانی دنیادا ،}

### |چەند سودێک لەم فەرموودەیە|

(1) گەورەیی وشەی لاالە الاالله دەردەخات .

(2) لاالە الا الله هۆکارە بۆ دامەزراوی خاوەنەکەی لە ناوگۆڕدا لە کاتی پرسـیار لێرکردن

(3) بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و هەبوونی پرسیارەکانی ناو گوڕ .

[30] [أخرجه البخاري (1369)، ومسلم (2871)].

4 کەسـێک لە ژیانی دونیای دا لەسـەر ئەم وشـەیە دامەزراو پێداگر نەبێت . ئەوا لە گوڕیشدا دامەزراو نابێت .

## فەرموودەی سی و یەک

عن أبي ذر الغفاري رضي الله عنه أنه قال لرسـول الله ﷺ: يا رسـول الله أوصني، فقال ﷺ : «إذا عَمِلْتَ سيئةً فأتبِعْهَا حسنةً تَمحُهَا، قالَ : قلتُ يا رسول الله أمِنَ الحسَناتِ لا إلهَ إلَّا اللهُ قالَ : هيَ أفضَلُ الحسَناتِ.» [31]

واتا : لە باوکی ذر ــی غفاری ــەوە الله لێی ڕازیبێت . بە پێغەمبەر ﷺ ــــمی فەرموو . ئامۆژگاریم بکە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ، «ئەگەر کارێکی گوناهەت کرد ئەوا چاکەیک بە دوای دابکە ، وتم ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایە لااله الا الله چاکەیە ؟، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوە گەورترینە .»

### چەند سودێک لەم فەرموودەیە

1 گەورەیی وشەی لااله الاالله دەردەخات .

2 کەسی موسـڵمان دەبێت لە خەمی خۆی دابێت و داوای ئامۆژگاری لە کەسی شیاو و متمانە پێکراو بکات.

[31] [المصدر : صحيح الجامع .الرقم: 5648 | خلاصة حكم المحدث : حسن | التخريج : أخرجه الترمذي (3590)، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (10669)]

③لااله الا الله هۆكاره بۆ ڕەش بونەوەی  گوناهەكان .

④لا اله الاالله  باشترین چاكەیە .

سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ

وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ.

لە دووعای خێربێبەشمان مەكەن

تەوحیدی

تەوحیدی